زۆربەتان ڕەنگە کتێبەکەتان بینیبێ و، تەرجەمەی زمانی کوردییش کراوە، من لە لاپەڕە (١٣٧ تاکو ١٨٣) چەند قسەیەکیم لێ دەرهێناوە، ئنجا ئێوە تەماشا بکەن، ئەو چی دەڵێ و، تەماشای واقیعی سیاسیی خۆشمان بکەن، دەزانن: ڕێك میکاڤیلی چی گوتوە، زۆربەی ئەو سیاسەتمەدارانەش، بەهەمان شێوە، ڕەفتاریان کردوە:

١- دەڵێ: پێویستە بابای حوکمڕان و بەرپرس، لە جیاتی خاوەن بەڵێنیی و وەفا بە پەیمان، پەیمان شکێن بێ، ئەگەرنا سیاسەتی بۆ ناکرێ.

٢- پێویستە بابای سیاسیی، لە جیاتی ئەوەی هەوڵبدا خۆشبویستریّ، لەلایەن خەڵکەوە، هەوڵبدا سامی لێ بکرێ و خەڵك لێی بترسێ.

٣- دەبێ لە جیاتی ئەوەی پەرە بە ڕەوشتە بەرزەکان بدات، خۆیشی و خەڵکیش لەسەر درۆو دەلەسەو فرت و فێڵ بار بێنێ.

٤- لەجیاتی ڕاستیی و ڕوونیی، دەبێ نیفاق و دووڕوویی لێڵیی هەبێ و، ئەگەر بەرپرسێك نیفاق و دووڕوویی نەبێ، سەرکەوتوو نابێ لە کارەکەیدا.

٥- لە جیاتی ڕەحم و بەزەیی، دەبێ زۆر دڵڕەق و توندو تیژ بێ.

٦- هەروەها ئامۆژگاریی حوکمڕان و بەرپرسی خۆسەپێن دەکات دەڵێ: خەڵك بەبۆنەو جەژن و شانۆگەریی و شتی پێکەنینایی و کۆمیدییەوە، زۆر سەرگەرم بکەو بەو شتانەوە، بیانخافڵێنە!

٧- هەروەها دەڵێ: دوژمنایەتیی جۆراو جۆر دروست بکە، دوژمنایەتیی ئەو حیزبە لەگەڵ ئەو حیزبەو...هتد، ئەگەر شتی وەهمییش بێ، بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵك بخەیە سەر ئەوە، کە تۆ نەیارو دوژمنت هەیەو، پێیانەوە گرفتاری!

تەماشا بکەن! ئەمریکا دوای ئەوەی (یەکێتی سۆڤیەت) هەڵوەشا، هەر بەرپرسەکانی ئەمریکا، ئەوانەی، کە سیاسەت داڕێژی ئەمریکان لە ڕووی فیکرییەوە، گوتیان: ئەوە دوژمنی سوور لە بەین چوو، ئنجا دەبێ سەرنجمان

بچێتە سەر دوژمنی سەوز [عالەمی ئیسلامیی]، کە بۆ خۆتان دەزانن عالەمی ئیسلامیی چەند بێ سەرو صاحێبە! بۆچی دەبێ سەرنجیان بچێتە سەر دوژمنی سەوز؟! چونکە دەبێ دوژمنێك هەر هەبێ، تاکو خەڵکی خۆیانی پێ بترسێنن، بیانخافڵێنن و ئاگایان لەو گرفت و کێشانە نەمێنێ، کە پێویستییان بە چارەسەر هەیەو، سەرنجیان لەسەر دەرەوەی خۆیان بێ!

٢- نموونەی دووەم: ئەویش هەر یەکێکە لەو زانایانەی ڕۆژئاوا، بەناوی: (ئیبتین دی لابواسییە)، کە هەر بە (لابواسییە) ناسراوەو لە ساڵی (١٥٣٠)ی زایینیدا لە دایك بووەو، لە ساڵی (١٥٦٢)دا مردووەو، تەمەنی (٣٢) ساڵ بووە، کتێبێکی هەیە بەناوی: (کۆیلایەتیی ئازادانە) (العبودية المختارة)، کە بە عەرەبی تەرجەمە کراوەو دەربارەی: کاریگەریی خراپ وماڵوێرانکەرانەی: (دانڕنرانی ڕەوشت و بەها بەرزەکان لە حوکم و سیاسەت) شتی زۆر جوانی هێناوە.

وێنەیەك دێنێتەوە، دەڵێ: کیسرای گەورە، دامەزرێنەری ئیمپڕاتۆریەتی فارس، شەش سەدە پێش زایین، کاتێك ئیمپڕاتۆریەتی فارس دادەمەزرێنێ، دەچێ وڵاتێك، بەناوی (لیدیا) لە مەمالیکی ئاسیای گچکە، ئەو وڵاتە دەگرێ، کە پایتەختەکەی شاری: (سارد)و پادشاکەشیان ناوی (کریسۆس) بووەو، بەدیلیی دەیبا بۆ وڵاتی فارس، بەڵام دوای ئەوەی کیسرا دەڕواتەوە، خەڵکەکە ڕادەپەڕن و ئاژاوە دەکەن، ئەویش وا دیارە پیاوێکی زۆر سیاسەتمەدار بووە، بەپێی مەزهەبی (میکاڤیلی) ڕاوێژ دەکات چییان لێ بکا؟ دەڵێن: ئەگەر تۆ ئێستا لێرەوە سوپایەك ببەی و لەدژیان بجەنگی، ئەوە زۆری دەوێ و، لە شوێنی دیکەوەش کێشەی زۆرمان هەن، ئیدی ڕایان دێتە سەر ئەوە دەڵێن: شوێنی داوێن پیسییان بۆ بکەوە، شوێنی شەڕاب خۆرییان بۆ بکەوە، شوێنی کۆمیدیی و شانۆگەریی و ...هتد، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە سەرگەرم بن، بەو شتانەوەو، کە سەر گەرم بوون و خافڵان و، لەژیانی جیدیی دوور دەکەوتنەوە، ئەو کاتە نایان پرژێتە سەر ئەوەی بزانن پاشایان بەدیل گیراوەو، وڵاتیان بۆتە موستەعمەرە! سەرەنجام ئەو نەخشەیە پیادە دەکەن و، وشەی (لۆدیی)، کە

لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: (لۆتیی)، پێشتر وام دەزانی: (لۆتیی) هەر لە وشەی (لوطي)ەوە هاتوە! بەڵام لاتینییەکان وشەی (لۆدیی)یان، کە بەکار هێناوە، بۆ یاریی و سوعبەت و خافڵان و قسەو جەفەنگ و لەهو و ...هتد، ئەسڵی خۆی لە (لیدیی)ەوە هاتوەو، وڵاتی (لیدیا) ئەوەندە مەشهوور بووە بە: خافڵان (لهو) و شانۆگەریی و مەیخۆریی و...هتدەوە، لەوانەوەو لەناوی شارەکەیانەوە: (لۆدیی) یان (لیدیی) بۆتە زاراوەیەك بۆ هەر جۆرە خافڵانێك و سەرگەرمییەك، کە هیچ نێوەڕۆکێکی نەبێ.

هەروەها (لابواسییە) قسەیەکی دیکە دەکات، زۆر سەرنجی ڕاکێشام، دەڵێ:

ئەو خەڵکە، کە لەو حوکمڕانە خۆسەپێنانە کۆدەبنەوەو، بە دەوری ئەو طاغووت و دیکتاتۆرانەوە دەئاڵێن، بریسکەی زێڕو زیوەکانیان، بریسکەی تاج و نەجمەکانیان، سەرسامیان دەکات و، لێیان نزیك دەبنەوە، بەڵکو شتێکیان پێ ببڕێ، بەڵام، لەو حاڵەتەدا، وەك ئەو پەپوولەو مێش و مەگەزە دێنە بەرچاو، کە ئاگر لە دوورەوە دەبینێ و، بۆ ئاگرەکە دەچێ، بۆ ئەوەی ئیستیفادە لە ڕوناکییەکەی بکات، بەڵام دوایی بە گەرمی و تینەکەی دەسووتێ! هەموو ئەو خەڵك و میللەتانەش، کە لە دەوری ئەو طاغووتانە دەئاڵێن، بە ئاگری ئەوانەوە دەسووتێن[1].

منیش دەڵێم: قسەکەی زۆر ڕاستەو هەروابووەو هەرواشە، بۆ نموونە: کاتی خۆی صەددامی دیکتاتۆری خۆسەپێن، چی بەو خەڵکە کرد، کە لەدەوری بوون! هیتلەر چی بە ئەڵمانیا کرد! ستالین چی لە (یەکیەتی سۆڤییەت) کرد! هەموو ئەو طاغووتانە تەماشا بکەن، بەدرێژایی مێژوو، هەموو ئەوانەی، کە

---

(١) بڕوانە: (كيف تفقد الشعوبُ المناعة ضدَّ الإستبداد؟) نووسینی:

أ- هشام علي حافظ

ب- جودت سعيد

ج- خالص جلبي

[العبودية المختارة] ص ٥٣-٨٩.

دەبن بەسەرباز بۆ ئەوانەو لەدەوریان دەئاڵێن، هەم لە ڕووی دنیاییەوە بە ئاگری وانەوە دەسووتێن، هەم لە ڕووی قیامەتییشەوە، بە ئاگری وانەوە دەسووتێن، بۆیەش خوای میهرەبان پێمان دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ... ﴿١١٣﴾ ﴾ هود.

واتە: پشت بەستەمکارانەوە مەدەن، ئاگرتان تووش دەبێ!

## نموونەیەکی زەقی لێك دابڕانی ڕەوشت و سیاسەت

بەپێویستی دەزانم کۆتایی ئەم تەوەرە: (داڕنرانی ڕەوشت و بەها بەرزەکان لەسیاسەت، دەرهاویشتەی زۆر خراپ، بگرە کارەساتباری دەبن)، بەنموونەیەکی زەقی گەرم و تازەی ئەم ڕۆژگارە بێنین، کە بریتیە لە: کوژرانی ڕۆژنامەنووس (جمال خاشقجي) هاووڵاتیی وڵاتی شانشینی عەرەبستان (المملكة العربية) لە کونسوڵخانەی سعوودییەدا، لەشاری (ئەستەنبۆڵ) لەڕۆژی: (٢/١٠/٢٠١٨)ز دا.

هەڵبەتە ئەو ڕووداوە ستەمێکی قێزەونی بێ پاساو بوو، بەدانپێداهێنانی حوکمڕانانی سعوودیە خۆشیان، دەرهاویشتەی زۆرو جۆراو جۆری بەدوای خۆیدا هێنان و ئێستاش بەردەوامن، پێموایە شانشینی عەرەبستان وا بەئاسانیی لێی دەرباز نابێ و، باجی گەورەی داوە لەسومعەو ئیعتیباری و، پێموایە باجی گەورەتریشی بەدواوەیە: باجی مەعنەویی و سیاسیی و ئابووریی و ...هتد.

بەڵام ئەوەی جێی مەبەستم بوو لێرەداو، پەیوەست بوو بە بابەتەکەمانەوە، بریتیە لە هەڵوێستی ئەمریکای هاوپەیمانی عەرەبستان بەگشتیی و، هەڵوێستی (دۆناڵد ترامپ) سەرۆکی ئەمەریکا، بەتایبەت:

کە پوختەی هەڵوێستەکەی (ترامپ) تاکو ئەم تاو (لحظة)ە، کە ئەم دێڕانەی تێدا دەنووسم: (شەوی ٢٢/٢٣-١١-٢٠١٨ز) بەرانبەر: (١٥/ربيع الأول/١٤٤٠ك)، هەر ئەوەیە کە دوێنێ شەو: (٢١/٢٢-١١-٢٠١٨ز) لەکۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانییدا "کەناڵی (الجزيرة) و کەناڵی دیکەش گواستیانەوە" ڕایگەیاند: لەسۆنگەی

ئەوەوە، کە ساڵانە چەندان ملیار دۆلار لە عەرەبستان بەهرەمەند دەبن، ناتوانن لەسەر کێشەی بەناهەق کوژرانی ڕۆژنامەنووس (جمال خاشقجي) بەینی خۆیان لەگەڵ سعوودیە تێك بدەن!

ئنجا ئەگەر وەزعەکە ئاوا بڕوا، کە (ترامپ) بەتەمایە، وا دیارە ئەمەریکا لەنێوان مەبدەئەکانی و بەرژەوەندییەکانیدا، بەرژەوەندییەکانی هەڵدەبژێرێ هەرچەندە - وەك شیکەرەوە (محلّل)ێکی سیاسیی گوتی: - بەرژەوەندیی و ملیار دۆلارەکان، خوێنی (خاشقجي)یشیان لێ بتکێ!!

ئنجا لێرەشدا ڕاستیی ئەو قسەیەمانمان لەلابەرجەستە دەبێ، کە گوتوومانە: (داڕنرانی ڕەوشت و بەها بەرزەکان لەسیاسەت، دەرهاویشتەی زۆر خراپ، بگرە کارەساتباری دەبن)، ڕاستیشیان گوتوە: (عند الإمتحان: يكرمُ المرءُ أو يهان) لەکاتی تاقیکردنەوەدا: مرۆڤ ڕێزدار، یان ڕیسوا دەبێ!!

براو خوشکەکانم!

دەپرسین: ئایا چۆن دەتوانین سیاسەتێکی ڕەوشتبەرزانە بکەین؟ کە پێم وایە ئێمەی (کۆمەڵی ئیسلامیی)، تا ڕاددەیەکی زۆر توانیومانە وا بکەین، بەڵام چۆن دەتوانین ئەوە زیاتر تۆخ بکەینەوە؟

پێموایە بناغەو هۆکاری ڕەوشت بەرزیی لە سیاسەتکردندا، لەچوار خاڵاندا خولاسە دەبێتەوە:

## ١) بوونناسییەکی ڕاست و دروست:

ئێستا لەنێو خەڵکدا زیاتر دەڵێن: (جیهانبینیی) و (دنیا بینیی)، بەڵام من ئەو وشەیەم پێ هەڵەیە، (جیهان)، یان (دنیا) تەنیا ئەوە دەگرێتەوە، کە ئێستا دەیبینی، بەڵام (بوونناسیی)، بوون (وجود) بینراو و نەبینراوی، دنیاو قیامەتی، بەدیهێنەر (خالق) و بەدیهێنراو (مخلوق)ی، هەمووی دەگرێتەوە، بۆیە پێم وایە: دەبێ (بوونناسیی) بەکاربهێندرێ ڕاستترە، وەك واتای وشەی: (معرفة الوجود ontology ئۆنتۆلۆژیی)[1].

بەڵێ، (بوونناسیی ئیسلامیی)، کە تاکە بوونناسیی ڕاست و دروستە، سەرچاوەی هەڵقوڵینی هەموو شتەکانی مرۆڤی مسوڵمانە: ئیمان و عەقیدەی، عیبادەتی، ڕەوشت و ئاکار و...هتدی دەگەڕێنەوە بۆ بوونناسییەکەی: ئایا چۆن خۆت دەبینی؟ ئەگەر وا خۆت دەبینی، کە جێنشینی خوای، ئەگەر وا خۆت دەبینی دروستکراوی خوای، ئەگەر وا خۆت دەبینی، خوا تۆی لەم سەر زەوییەدا داناوە، تاکو تاقیت بکاتەوە.

---

(١) لەکتێبی چوارەمی مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا)دا، (پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی) بەدرێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

هەروەها ئەگەر وا ژیانی دنیا دەبینی، کە قۆناغێکە لە قۆناغەکان و، قۆناغی دیکەی بەدوادا دێ، ئەوکاتە دەزانی چۆن دەژی! بەڵێ، بەڕاستیی هەر جۆری بووناسیی مرۆڤی مسوڵمانە، کە ئیمان و عەقیدەکەشی دیاریی دەکا، ئایا کێ بڕوا بەخوا دێنێ؟

بێگومان ئەو کەسەی، کە خوا دەناسێ، پێشێ مرۆڤ دەبێ خوا بناسێ و، بزانێ: خۆیی و دەوروبەری و گەردوون، چۆن دروست بوون؟ ئنجا لەسەر بناغەی دەرککردنی ئەو ڕاستییە کە: دروستکراوەکان هەموویان پێویستییان بە بەدیهێنەرێك و، بە خاوەنێك هەیە، ئنجا دوای ئەوە ئیمان بەخواو بە پایەکانی دیکەی ئیمان دێنێ.

## ٢) ئیمان و عەقیدەی ڕاست و ساغ:

واتە: ئیمان بە خوا، بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی، بە پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام)، بە ڕۆژی دوایی، بە قەدەرو، بە هەموو ئەو شتانەی دیکە کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێندرێ.

بێگومان ئیمان سەرچاوەی تێکڕای خەسڵەت و ئاکارە پەسندەکان (فضائل)ەو، تاکو مرۆڤی مسوڵمان ئیمان و عەقیدەی ڕاستترو ڕۆچووتربێ، ڕەوشتی بەرزتر دەبێ.

## ٣) خواپەرستیی و پارێزكاریی:

بێگومان وەك چۆن ئیمان و عەقیدەی ڕاست و ساغ، هەڵقوڵاوی بووناسییەكی ڕاست و دامەزراوە، بەهەمان شێوەش: بە ئەندازەی چەسپاویی ئیمان، مرۆڤی مسوڵمان و خەڵك و كۆمەڵگای مسوڵمانیش بەگشتیی و، كەسانی سیاسیی و مشوور خۆریش بەتایبەت، خوا پەرستیی و دینداریی و بۆ خوا سوڵحان و پارێزكارییان، باشتر دەبێ، چونكە گۆزە چی تێدابێ، هەر ئەوەشی لێ دەڕژێ.

ئنجا بەدڵنیاییش، خوا پەرستیی و پارێزكاریی (العبادة والتقوى) كە بەرهەمی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیین، دەبنە هەوێن و هەناو و كاكڵ و جەوهەری، سەرجەم بیروڕاو هەڵس و كەوتەكانی تاك و كۆمەڵ، وەك ئایەتەكانی كۆتایی سووڕەتی (الفرقان) بە درەوشاوەیی ئەوەی گوتمان پێشانی دەدەن، چونكە خوای زاناو شارەزا، بەندە هەڵبژاردەكانی خۆی بەناو و نیشانی: (عبادالرحمن) دەناسێنێ و، دواتر پاش ئەوەی بە پازدە (١٥) خەسڵەتی بەرزو پەسند پێناسەیان دەكات، لەكۆتا خەسڵەتیاندا "كە پازدەیەمینە" ئەو پاڕانەوەیە یان لێ دەگێڕێتەوە كە دەڵێن: (...واجعلنا للمتقين إماماً) بمانگێڕە بە پێشەوای پارێزكاران، كەواتە: تەنیا كەسانێك شایستەیی پێگەی پێشەوایەتیی مسوڵمانانی پارێزكاریان هەیە، كە خاوەنی كۆی ئەو خەسڵەت و ئاكارە بەرزو پەسندانەبن، ئەوەش دەقی ئەو چواردە (١٤) ئایەتە موبارەكەی (الفرقان):

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟
سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا
ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا
وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا
﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا

بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ
ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَإِنَّهُۥ
يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابٗا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامٗا
﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ
يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ
إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا
﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٧٦﴾ ﴾ الفرقان.

## ٤) دڵسۆزیی و خۆشەویستی بۆ خەڵك:

هیچ گومانی تێدانیە، کە ئەم پایەی چوارەمە، بەرهەمی پایەکانی پێش خۆیەتی، بەڵێ بەڕێزان! دوای هەبوونی:

١) بووناسییەکی ڕاست و دروست و،

٢) ئیمان و عەقیدەیەکی ساغ و،

٣) خواپەرستیی و پارێزکارییەکی باش و،

٤) دڵسۆزیی و خۆشەویستییەکی چاك بۆ خەڵك،

ئەوجار دەتوانین لە سیاسەتکردندا ڕەوشتێکی بەرزمان هەبێ، ئەگەرنا، تۆ دنیا بە تاکە دەرفەتێك بزانی، کە زیاتر تێیدا ڕابوێری و، لەززەت وەربگری، یان تێیدا دەوڵەمەند بی، خۆت و خزم و حیزبت، ئەو کاتە ئەو بیرکردنەوەیەت وات لێدەکا، کە بەو شێوەیە ڕەفتار بکەی، کە گوێ نەدەی بە ئەخلاق و ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند!

## پوختەی مەبەست و
## دەرەنــجـــام

**ئنجا با بێینە سەر دەرەنجام و کۆتایی هەموو بابەتەکە:**

براو خوشکانی بەڕێز! ئێمە وەك (کۆمەڵی ئیسلامیی) ستایشی خوای پەروەردگار دەکەین، کە ئێمەی خستۆتە سەر ڕاستە شەقامی خۆی و ئومێدم وایە هیدایەتی دابین، کە سیاسەتکردنەکەشمان بەشێوەیەکی شەرعییانەو ڕێك و پێك بووبێ، تاکە ڕاددەیەکی باش، بەڵام ئەوە مانای وانیە، کە پێویستییمان بەچاوبەخۆدا گێڕانەوەو، ڕەخنە لەخۆ گرتن و خۆپشکنین نیە، بێگومان بەردەوام، دەبێ خۆمان بپشکنین و، ئاگامان لەخۆمان بێ.

ئنجا کۆتایی هەموو بابەتەکە، بەم حەوت خاڵە دێنم، وەك دەرەنجامی کۆتایی:

**١)** ڕەوشت بەرزیی، لە هەموو ڕوویەکەوەو بەهەموو جۆرەکانیەوە، مایەی سەربەرزیی و بەختەوەریی دنیاو دوارۆژە، تەماشا بکەن! خوا (سبحانە وتعالی) کە مەدحی پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم)، دەکات، کە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) لە هەموو ڕوویەکەوە لە لووتکەدا بووە، بەڵام پێی دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم.

واتە: بەدڵنیایی تۆ ڕەوشتێکی مەزنت هەیە.

بۆیەش پیتی [لەسەر] (عَلَى)ی بۆ بەکارهێنراوە، یانی: تۆ ڕەوشت و ئاکاری مەزنت خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆتەوەو، ڕەوشتی پەسندو جوان بۆتۆ، وەك وڵاخێكی دەستەمۆو ڕامکراوە.

زۆر کەس دەتوانێ سیاسیی بێ، سیاسیی بەو مانایەی، کە ئێستا باوە، زۆر کەس دەتوانێ ئەهلی علیم بێ، دەتوانێ چی بێ و چی بێ، بەڵام مەگەر کەسێ دڵەکەی بەخواوە پەیوەست بێ، ئەگەرنا ناتوانێ لە هەموو حاڵێکدا، ڕەوشتێکی بەرزو مەزنی هەبێ، بۆیە خوای بەرزو مەزن، پێغەمبەری خۆی بە شتێك مەدح دەکا، کە مەگەر هەر ئەو پێغەمبەرە مەزنە (صلى الله عليه وسلم)و کەسێك، کە بەرێی ئەودا دەڕوا، ئەوەی بۆ مەیسەربێ.

**٢)** ڕەوشت بەرزیی و ئاکار پەسەندیی لە بواری سیاسەتدا، وەك هەموو بوارەکانی دیکە، فەرزەو، بەشێکە لە دینداریی و مسوڵمانەتیی، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ ﴾ النساء: ١٢٥.

واتە: دینداریی کێ لە هی کەسێك چاکترە، کە ڕووی خۆی تەسلیمی خوا کردوە (بۆ خوا ساغ بۆتەوە)و چاکەکاریشە! {یانی: بۆ خوا دڵسۆزەو، لەگەڵ خەڵکدا چاکەکارە}.

هەروەها خوای پاك و تاك فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ النحل.

واتە: بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانەدایە، کە پارێزکارن و، ئەوانەی کە چاکەکارن.

**٣)** ڕەوشت بەرزیی سیاسیی، مرۆڤ لە عەیبداریی لای خەڵك و، گوناهباریی لای خوا دەپارێزێ، ئینسان کە درۆی نەکردو، وەعدە خیلاف نەبوو و، شتی ژێر بەژێری نەبوو و، موخەننەت نەبوو و، بۆ هەموو لایەك دڵسۆز بوو، ڕاست و ڕوون بوو، ڕاشکاو بوو، ئەوکاتە: هیچ کەسێك ناتوانێ ڕەخنەیەکی شەرعیی بێنێتەوە سەرێ، واتە: کە لە شەرع لایدابێ.

بەڵێ بەڕێزان! بەخوا هەر کەسێك لە شەرع لانەدات، نە گوناهباری لای خوا دەبێ و، نە عەیبداری لای خەڵکیش.

٤) بەهۆی ڕەوشت بەرزییەوە، خەڵك و وڵات لەو بەڵاو نەهامەتییانە دەپارێزرێ، کە دەرهاویشتەی ڕەوشت نزمیی و خراپەکاریین، بەتایبەت هی حوکمڕانان و سیاسەتمەداران، چونکە کەسێك، کە لە ماڵی خۆیدا خراپەیەك دەکاو ڕەوشتێکی خراپی هەیە، زیاتر زەرەر لە خۆیی و ماڵ و منداڵەکەی دەدا، بەڵام کاتێك سیاسییەك حوکمڕانێك، غەڵەتێکی سیاسیی دەکا، ڕەوشتێکی خراپی سیاسیی دەبێ، زەرەر لە خۆی و خەڵکی وڵاتەکەی دەدا، بەگشتیی.

٥) مرۆڤی ئاکار پەسەند و ڕەوشت و بەرز، هەمیشە دڵئاسوودەیەو بێ باکە، ئەوەی پەریێزی پاکە، بێ باکەو دڵی مورتاحە، چونکە: درۆی لەگەڵ کەسدا نەکردوە، فێڵی لە کەس نەکردوە، خیانەتی بەکەس نەکردوە، بوغزی بەرامبەر بە کەس نیە، بەڵێ، ڕقی لە زوڵمە، ڕقی لە لادانە، ڕقی لە خراپەیە، بەڵام دڵسۆزە بۆ مرۆڤەکان.

زۆر کەس ڕەنگە ئەو دووانەی بۆ لێك جیا نەکرێنەوە:

ئێمە دەگونجێ ڕقمان لە زوڵم و فەسادو خراپەو، ماڵی گشتی بەهەدەردان و، قۆرخکاریی بێ، بەڵام بەزەییمان بە مرۆڤەکان دا بێ و بۆیان دڵسۆز بین، چونکە خوای پەروەردگار مرۆڤەکانی بۆیە دروستکردوون، کە بەختەوەربن، بەڵام کە بەهۆی خراپەوە خۆیان بەدبەخت دەکەن، دەبێ ڕقت لە خراپەکەیان بێ، بەڵام وەك مرۆڤ پەرۆشیانت بێ و، بەزەییت پێیاندا بێ و، بۆیان دڵسۆز بی.

٦) تەنیا بەهۆی سیاسەتکردنی ڕەوشت بەرزانەوە، ئامانج و مەبەستە پەسندو بەرزەکان، بە باشترین شێوەیە دەستەبەر دەبن.

٧) ڕەوشتبەرزیی سیاسیی، مایەی ڕەزامەندیی خواو، پاداشتی نەبڕاوەی خوایە.

ئەم ئایەتە موبارەکەش دەکەمە میسکی خیتامی هەموو بابەتەکە:

﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ القصص.

واتە: ئەم مەنزڵگای دوا ڕۆژە، تایبەتی دەکەین بە کەسانێکەوە، کە نایانەوێ بەرزیی و خۆهەڵکێشان لە زەویدا، بکەنە پیشەیان و، ناشیانەوێ خراپەکاریی بکەن، (بەڵکو دەیانەوێ: خوای پەروەردگار لە خۆیان ڕازی بکەن)، سەرەنجامیش بۆ پارێزکارانە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، ئێمە لە پارێزکاران بگێرێ و، لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە لە سیاسەتکردندا خۆیان بە ڕەوشتە بەرزەکان دەڕازێننەوە، تاکو ئەو حەوت بەرهەمەی خستماننەڕوو، دەستەبەریان بکەین.

دوا پێداچوونەوە و ئامادەکردنی بۆ چاپ

٢٩ / ١ / ٢٠١٩ ز
٢٣ / ٥ / ١٤٤٠ ك
هـــــــــەولـێـر

دواپێداچوونەوە بۆ چاپی دووەم:

٢٠٢٠/١٠/٢ز
١٤٤٢/٢/١٥ك

# بەرهەمەکانی دانەر

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | أ / کتێبە کوردییەکان | | |
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟) و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سووڕەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دەیەم: سووڕەتی: (هود) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سووڕەتی: (یوسف) | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ١٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دوازدەیەم: سووڕەتەکانی: (الرعد، إبراهيم، الحجر) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێزدەم: سووڕەتی: (النحل) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چواردەم: سووڕەتی: (الإسرا) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پازدەم: سووڕەتەکانی: (الكهف، مريم) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٨ | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە نێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٩ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسە و گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی | | |
| ٢٠ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ٢١ | ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |
| ٢٢ | پرۆژەی بەرنامەی پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامییانە | چاپی یەك/١٩٩٥ | دواتر خرایە نێو کتێبی: (پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی) |
| ٢٣ | پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ٢٤ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی چوار/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٥ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعیانەوهەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی شەش/٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش |
| ٢٦ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (درەوشاوەیی ئیسلام و پووچەڵیی ئیلحاد) | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی سێ/٢٠٢٠ | |
| ٢٧ | ناوە هەرەجوانەکانی خوا "سبحانه وتعالی" | چاپی یەك /٢٠١٣ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ |
| ٢٨ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٢٩ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٣٠ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٣١ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٣٢ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | - |
| ٣٣ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٣٤ | مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |
| ٣٥ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی(هاووڵاتیی)و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٣٦ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢ چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣٧ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طەحاویی | چاپی دوو/٢٠١٧ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٨ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحــاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ٣٩ | سیکۆلاریزم و دیموکڕاسیی لە ئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و، شێوەزاری کرمانجیی |
| ٤٠ | درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحییدا | چاپی یەك/٢٠١٩<br>چاپی دوو/٢٠٢٠ | |
| | مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا | | |
| ٤١ | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەت و سەر گوزشتە و سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | ـ |
| ٤٢ | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | ـ |
| ٤٣ | کتێبی سێیەم: تەوژمە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٤٤ | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ | ـ |
| ٤٥ | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك/٢٠١٩ | ـ |
| | زنجیرەی: باچاکتر ئیسلام بناسین! | | ـئەم سێ ئاڵقەیە: دوایی خرانە نێو مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە |
| ٤٦ | ئاڵقەی یەکەم: سەلماندنی بوونی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | ـ |
| ٤٧ | ئاڵقەی دووەم: پێغەمبەران "علیهم الصلاە والسلام" | چاپی یەك/١٩٨٩<br>چاپی دوو/١٩٩٠ | ـ |
| ٤٨ | ئاڵقەی سێیەم: ڕۆژی دوایی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٤٩ | ئاڵقەی چوارەم: ئایین | ـ | دوایی خرایە نێو کتێبی: (خواناسیی, ئایین, ئیمان) |
| ٥٠ | بیررو بڕوا | چاپی یەك/١٩٩٠ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| فیقهی ئیسلامیی | | | |
| | مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠ چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٥١ | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاك و خاوێنیی | | |
| ٥٢ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین درووشمی خواپەرستیی | | |
| ٥٣ | بەرگی سێیەم: زەکات و ماڵ بەخشین | | |
| ٥٤ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەکردن، زیکری خواکردن | | |
| ٥٥ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسوکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٥٦ | جەژن و یادو بۆنەکان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٥٧ | چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە |
| ٥٨ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار | | | |
| ٥٩ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٦٠ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |
| ٦١ | تەزکیەو تەبایی و، یەکڕیزیی و برایی | چاپی یەك/١٩٩٨ | |
| ٦٢ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦٣ | گەڕانەوە بۆ لای خـوا (سبحانە وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخان و، وازهێنان لە گوناە و سـەرپێچیی و، گۆڕانكاریی ڕیشەیی بەسـەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٦٤ | شـەهید كێیەو چ پلـەوپایەیەكی هـەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٦٥ | باسـێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزنەوە، لەدنیاو دوارۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٦٦ | گیانی ژیـان: باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٦٧ | مەوسـووعەی:ڕەوشت و ئاكاری ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشـنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٦٨ | ئەدەب و ڕەوشتە كۆمەڵایەتییەكان لەبەر ڕۆشنایی وەحیی و عەقڵدا | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | بانگەوازو كاری ئیسـلامیی | | |
| ٦٩ | كۆمەڵـی خـوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٧٠ | پێشمەرگەی ئیسـلام، یان مسـوڵمانی موجاهید كێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی چوار/٢٠٢٠ | |
| ٧١ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسـلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٧٢ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی و قۆناغی نوێ | چاپی یەك/١٩٩٤ | |
| ٧٣ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك / ١٩٩٥ | |
| ٧٤ | هەڵسەنگاندن و هەڵوێستمان لەم قۆناغە | چاپی یەك / ١٩٩٥ | |
| ٧٥ | تێگەیشتن | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |
| ٧٦ | چەند ڕێڕوونییـەك بۆ ئیسـلامییەكانی كوردسـتان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٧٧ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەكی گەش و ڕوون، بنەما شەرعییەكان و بنچینە ئەخلاقییەكان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | |
| ٧٨ | ئیسـلام و كێشـە هەنووكەیی یەكان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٧٩ | زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٨٠ | کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٨١ | هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا و، چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٨٢ | چۆن لە جیهاد تێ بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٨٣ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٨٤ | جیهاد لەڕێی خوادا/ بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەین و لەسەر جەنگ کردنمان قەرزدار نەبینەوە | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٨٥ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٨٦ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٨٧ | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٨٨ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٨٩ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٩٠ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەڕگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٩١ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٩٢ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ٩٣ | بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن | چاپی یەك/ ٢٠١٩ | |
| ٩٤ | هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/ ٢٠١٩ | |
| ٩٥ | کێ شایستەی مینبەر و میحرابە | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | | | |
| ٩٦ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٩٧ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٩٨ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی |
| ٩٩ | چۆن گەشە بە کۆمەڵی ئیسلامی بدەین؟ | چاپی یەك / ٢٠٢٠ | |
| وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان | | | |
| ١٠٠ | کارو پڕۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٠١ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ١٠٢ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد | | |
| ١٠٣ | کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ١٠٤ | مەسەلەی کورد چیەو چۆن و بەچی چارەسەر دەکرێ؟ | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ١٠٥ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ١٠٦ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی سێ/٢٠٠٥<br>چاپی چوار/٢٠١٨ | |
| ١٠٧ | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| ١٠٨ | چەند ڕێنموویەك بۆ حاڵەتی ئیسلامیی لە کوردستاندا | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٠٩ | جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووکان | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | سیاسەت و حوکمڕانیی | | |
| ١١٠ | چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ) | | چاپی یەك / ٢٠١٤ |
| ١١١ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ١١٢ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ١١٣ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان): یاسادانان - جێبەجێکردن - دادوەریی | | |
| ١١٤ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ١١٥ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٧ |
| ١١٦ | قوڕئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | | چاپی یەك/٢٠١٨ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١١٧ | گرنگیی ڕەوشت لەسیاسەتدا | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ١١٨ | واقیعی دژواری ئوممەت: هۆكار و چارەسەر | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ١١٩ | ئافرەتی مسـوڵمانی كورد، مافە شەرعییەكانی و ئەركە گرنگەكانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣<br>چاپی دووەم / ٢٠٠٣ | |
| ١٢٠ | مەوسـووعەی : ئـافرەت و خێزان لە سایەی شـەریعـەتدا | بەرگی یەكەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | **مـێــــژوو** | | |
| ١٢١ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، دەرس و پەندەكانـی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ١٢٢ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەكانم)، بەشی یەكەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٢٣ | بەركوڵێكی كاروچالاكیی و ڕووداوەكانی ژیانم (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپی یەك/٢٠١٨ | بۆ هەردوو زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی وەرگێردراوە |
| | **دیدارو گفت وگۆ** | | |
| ١٢٤ | سـنووره قەدەغەكان مەشكێنن! (چاوپێكەوتنی دكتۆرحسـین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | - |
| ١٢٥ | ئەشكەنجــەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زینــدانی داگیـركەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسـیشی كراوەو چـاپ و بڵاوكراوەتەوە، هەروەهابۆزمانی ئینگـلیزیش وەرگێڕراوەو چـاوەڕێی چاپە |
| ١٢٦ | گەنج لە چەمكە هەنووكەییەكاندا | چاپی یەك/ ٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەی بابەتە هەنووكەییەكان** | | |
| ١٢٧ | گەنجەكانـمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی كردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسـییش وەرگێڕراوە |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٢٨ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٢٩ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | - |
| ١٣٠ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٣١ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٣٢ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٣٣ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٣٤ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٣٥ | بانگەواز بۆ لای خودا چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٣٦ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٣٧ | واقیعی هەرێمی کوردستان ، دیدێکی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٣٨ | سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ١٣٩ | کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەم ومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٤٠ | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٤١ | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٤٢ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٤٣ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٤٤ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٤٥ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٤٦ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٤٧ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| **ب/کتێبە عەرەبییەکان** | | | |
| | موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله | ط الاولى/٢٠١٥ | |
| کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | | | |
| ١٤٨ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٤٩ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١٥٠ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٥١ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٥٢ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٥٣ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٥٤ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | ط الثانية/٢٠١٨ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٥٥ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٥٦ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٥٧ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | ط الثانية/٢٠١٩ | |
| ١٥٨ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٥٩ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٦٠ | نقض فكرة التطرف | ط الاولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) | |
| ١٦١ | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | - |
| ١٦٢ | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٦٣ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى/ ٢٠١٦ | |
| ١٦٤ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |
| ١٦٥ | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩<br>ط الثاني/٢٠١٣ | |
| ١٦٦ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٦٧ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| ١٦٨ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الاولى/ ٢٠٠٥<br>ط الثالثة/ ٢٠٢٠ | |
| ١٦٩ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١<br>ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| ١٧٠ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٧١ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى والثانية/٢٠١٨ | |
| ١٧٢ | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى /٢٠١٧ | |
| ١٧٣ | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| ١٧٤ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأُمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| | ئەو كتێبانەی لەژێر چاپن | | |
| ١٧٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز/ تاکو سوورەتی: (الناس) خوا پشتیوان بێ کارکردن تێیدا بەردەوام دەبێ تاکو هەمووی چاپ دەکرێ. | | |
| | مەوسووعەی: بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن | | |
| ١٧٦ | بەرگی یەکەم: واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆکارو چارەسەر | | |
| ١٧٧ | بەرگی دووەم: هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | | |
| ١٧٨ | بەرگی سێیەم: چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەڵگا و پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی | | |
| ١٧٩ | بەرگی چوارەم: بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن | | |
| ١٨٠ | بەرگی پێنجەم: پایەکانی بووناسیی و، ڕوونکردنەوەی ئیمان | | |
| ١٨١ | بەرگی شەشەم: خواپەرستیی، تەزکیە، تەقوا | | |
| ١٨٢ | بەرگی حەوتەم: بنەما گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | | |
| ١٨٣ | بەرگی هەشتەم: تایبەتمەندییە ئیمانیی و فیکرییەکانی جەماوەری مسوڵمانان | | |
| ١٨٤ | بەرگی نۆیەم: ڕەوشتبەرزیی دروشمی سەرەکیی جەماوەری مسوڵمانان | | |
| ١٨٥ | بەرگی دەیەم: چوار بابەتی سیاسی گرنگ و هەستیار | | |
| ١٨٦ | بەرگی یازدەیەم: بنچینە گرنگەکانی تەبایی و یەکڕیزیی مسوڵمانان | | |
| ١٨٧ | بەرگی دوازدەیەم: بنەڕەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ | | |
| ١٨٨ | قورئان و سوننەت وەك ڕۆح و جەستە تێکهەڵکێشن | | |

# پێڕستە وشە

ئـ

ئاکار : ٧, ٩, ١٠١, ١٠٦, ١٠٧, ١١٣

ئامراز : ٢٨

ئەخلاق : ٢٩, ٩١, ١٠٤

ئەمانەت : ٥٢, ٨١

ب

بەرپرس : ١٠, ١٢, ٥١, ٥٩, ٦١, ٦٢, ٦٣, ٦٤, ٦٧, ٦٨, ٦٩, ٧٥, ٨٣, ٨٦, ٩٣

بەڵێن : ٢٧, ٢٩, ٥٠

بەها : ١٤, ١٨, ٢٧, ٢٨, ٢٩, ٣١, ٦٠, ٨٠, ٨٧, ٩٢, ٩٤, ٩٧, ٩٨

پ

پەسەند : ١٠٧

پەیمان : ١٦, ٢٧, ٢٩, ٥٠, ٩١, ٩٣

ت

توندڕەو : ٣٢, ٣٣

ج

جاسووس : ٦٨

ح

حوکم : ٩, ١٨, ٢٣, ٣٠, ٣٣, ٨٣, ٩٤, ١٢٣

د

دادگــەریی : ٩, ٢٣, ٤٠, ٤١, ٩٢
دڵسۆز : ٨١, ١٠٦, ١٠٧
دەستەڵات : ٣٣

س

سیاسەت : ٢, ١٤, ١٥, ١٦, ١٧, ١٨, ٢١, ٢٢, ٢٣, ٢٧, ٢٩, ٣١, ٣٣, ٨٠, ٨٧, ٩١, ٩٢, ٩٣, ٩٤, ٩٧, ١١٦, ١٢١, ١٢٣

ش

شەریعەت : ٢٢, ٣٣, ٦٠, ٨١, ٨٦, ١٢٢

ف

فـێـرکردن : ٦٠, ٩١

ك

کۆمەڵگا : ٢٣, ٣١, ٣٧, ٧٧

ل

لێبوردن : ٣٨, ٥٨

ن

ناپەسەند : ٤٣

ڕ

ڕاوێــژ : ٤٢, ٩٠, ٩٤
ڕەوشت : ٢, ٩, ١٠, ١١, ١٤, ١٧, ١٨, ٢١, ٢٢, ٢٣, ٢٧, ٢٨, ٢٩, ٣١, ٣٧, ٤٧, ٤٨, ٥١, ٥٣, ٥٥, ٦٠, ٧٧, ٨٠, ٨٧, ٩٠, ٩٢, ٩٤, ٩٧, ٩٨, ٩٩, ١٠١, ١٠٤, ١٠٥, ١٠٦, ١٠٧, ١١٣, ١١٨, ١٢١

# کورتەیەک لە مێژووی ژیانی
# مامۆستا عەلی باپیر



ناو: عەلی باپیر وەتمان

لە دایکبووی: ساڵی (١٩٦١ز)دا لەقەزای پشدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.

• زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیەو سلێمانیی)و لە لای زانایانی کوردستانی عێراق و «دواتریش کوردستانی ئێران» بەدەستهێناون، لەساڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەپێزی لەبەر کردووە.

• لە ساڵی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتووە ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووە، کۆلیجی شەریعەت.

• لەساڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق و لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو، لە مزگەوتی (نۆڕسیی) لە شاری ڕانیە دامەزراوەو، بەردەوام بووە لەسەر دەرس گوتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی و...هتد.

• یەکەمین بەرهەمی لەساڵی: (١٩٨٣)زدا نووسیوە بەناوی: (پوختەیەک دەربارەی ئیسلام) پاشان کتێب و بەرهەمەکانی بەردەوام بوون کە ئێستا ژمارەیان لەسەد (١٠٠) تێپەڕیوە، لە مەوسووعەو کتێب و نامیلکەو، بەزمانی کوردیی و عەرەبیی و، هەندێك لە کتێبەکانیشی کە بەزمانی کوردیی نووسیونی، بۆ زمانەکانی: عەرەبیی و، فارسیی و، تورکیی و، ئینگلیزییش وەرگێڕراون.

• لەساڵی (١٩٨٧ز)دا پاش ساڵانێك لە خەباتی ئاشکراو نهێنیی پەیوەست لەگەڵ {بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی}دا، کە لەکۆتایی حەفتایەکانی سەدەی پێشوودا ڕێکخستنە نهێنییەکانی دامەزران، چۆتە چیاو دەستی بەخەباتی چەکداریی کردوە لە چوارچێوەی بزووتنەوەی ئیسلامییدا، کە لەچەند ناوچەیەکی کوردستاندا بنکەو بارەگای سەربازیی هەبوو دژی ڕژێمی بەعس و، هێزی حەمزەی لە بناری چیای قەندیل دامەزراند.

• لە ساڵی (١٩٨٨ز)دا بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

• لەساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١ز)داو وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان، لە مەبەست و ئامانجەکانی ڕاپەڕینی جەماوەریی و ناساندنی بزووتنەوەی ئیسلامییدا.

• تاکو ساڵی (٢٠٠١ز) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوە، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هێزو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.

• لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا مایەوە، هەر لەزینداندا مەوسووعەی: (الإسلام کما یتجلي في کتاب الله)ی لە دوازدە کتێب و زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسیی و، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز) دا لەزیندان ڕزگاری بوو.

• تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) بەرهەمی هەیە لە: مەوسووعەو کتێب و نامیلکە، لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی و عەقیدەو فیقهو حوکم و سیاسەت و تەزکیەی نەفس و ئەخلاق و، بەرپەرچدانەوەی بیرو ڕێچکە نامۆیەکان و...هتددا.

• لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووە، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.

• کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە، لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز) داو، لەهەموویاندا، بەئەمیر هەڵبژێردراوەتەوە.

• ئێستا پڕۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردووەو، تا ئێستا چەند بەرگێکی لێ چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

بۆ زانینی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:

www.alibapir.net

/alibapir /alibapir1 /MediaAmeerOffice

لە تۆرە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# نێـوەڕۆك

پێشكەش بێ........................................................ ٧
پێشەكیی چاپی دووەم................................................ ٨
سەرگوزشتەی ئەم كتێبە.............................................. ٩
پێشەكیی و ڕێخۆشكردن............................................ ١٣

**تەوەری یەكەم: پێنـــاســـــە**........................................ ١٩

١) ڕەوشـــت (أخــلاق):................................................ ٢١
٢) ســـیاســەت: ...................................................... ٢٢
٣- ڕەوشـــتی ســیاســی:.............................................. ٢٣

**تەوەری دووەم: تێكگیرانی ڕەوشتی بەرز و كاری سیاسیی، كێشەیەكی لە مێژینەی بەشەرە**........................................................ ٢٥

**تەوەرەی سێیەم: ڕەوشتە بەرزە سیاسییە بنەڕەتییەكان**............ ٣٥

١) ڕاســتیی (الصــدق):................................................ ٣٧
٢) دڵســـۆزیی (النصیحـــة):........................................ ٣٩
٣) دادگــەریی (العــدل): ............................................. ٤٠
٤) ڕاوێـــژكردن (الشـــوری):........................................ ٤١
٥) مشـــوورخۆریی (الموالاة):........................................ ٤٢
٦) فەرمان بە پەسەندو ڕێگریی لە ناپەسەند (الأمــر بــالمعروف والنهي عـن المـنكــر):........................................................ ٤٣
٧) خوا پێ مەبەست بوون و نیاز پاكیی (الإخلاص):.................... ٤٤
٨) ئـامـانج بەرزیـی (سـمـو الغـایة):................................. ٤٦

٩) بوێریی و ئــازایەتیی (الجرأة والشجــاعـة): ........................................ ٤٦
١٠) ڕوونیی و ڕاشكاویی (الوضوح والصـراحــة): ........................................ ٤٨
١١) وەفــاداریی (الوفاء): ........................................ ٥٠
١٢) ئەمانەتپارێزیی (الأمــانة): ........................................ ٥١

**تەوەری چوارەم: ڕەوشــت و ئاكارە سیاسییە بەرزەكانی بەرپرسان** ........ ٥٣

١) بــەزەیی و پــەرۆش: ........................................ ٥٥
٢) نــەرم و نیــانیــی: ........................................ ٥٦
٣) لێبوردەیی و چاوپۆشیی: ........................................ ٥٧
٤) خاكیی بوون و خۆ بەكەمگریی (التواضـع): ........................................ ٥٨
٥) خۆڕاگریی لە بەرانبەر نەفامیی نەفامان دا: ........................................ ٥٩
٦) فـێـركردن و ڕێنمــایی كردن: ........................................ ٦٠
٧) چاوپێداگێڕان و پشكنینی حاڵ و باڵی خەڵك: ........................................ ٦١
٨) سووربوون لەسەر پاراستنی ماڵ و سامانی گشتی: ........................................ ٦٣
٩) تێكەڵیی لەگەڵ خەڵك و خۆ لێ نەشاردنەوەیان: ........................................ ٦٤
١٠) داخستنی دەرگای جاسووسیی و قسە هێنان و بردن: ........................................ ٦٦
١١ و ١٢: لێپرسینەوەو سزادانی خراپەكاران و، ڕێزلێگرتن و هــاندانی كەســانی دڵســۆزو شــایســتــە: ........................................ ٦٩

**تــەوەری پێنجەم: ڕەوشتە بەرزە سیاسییەكانی خەڵك، لەگەڵ بەرپرس و حوكمڕاناندا** ........................................ ٧٥

١) خۆ بە بەرپرسیارزانین بەرانبەر بە كۆمەڵگا: ........................................ ٧٧
٢) فەرمانبەریی بۆ بەرپرسان لە بازنەی شەریعەتدا: ........................................ ٧٩
٣) ڕێز لێگرتنی بەرپرسان و پشتگیریی كردنیان لەسەر هەق: ........................................ ٨٠
٤) بە نەرمیی و لێزانیی دواندنی بەرپرسان: ........................................ ٨٣
٥) ڕەخنە لێگرتن و قسەی حەق گوتن بە بەرپرسان و گێڕانەوەیان لە هەڵەو لادان، لەڕووی بەتەنگەوە بوون و دڵسۆزییەوە، نەك لە ڕووی بوغزو غەرەزەوە: ........ ٨٤

٦) خۆ دوورگرتن لە خیانەت و فێڵ و کاری ژێر بە ژێر:.................... ٨٦

**تەوەری شەشەم: داڕنرانی ڕەوشت و بەها بەرزەکان لە سیاسەت، دەرهاویشتەی زۆر خراپ، بگرە کارەساتباری دەبن ............................ ٨٧**

نموونەیەکی زەقی لێك دابڕانی ڕەوشت و سیاسەت.................. ٩٧

**تەوەری حەوتەم: بناغەو هــۆکارەکانی ڕەوشت بەرزیی لە سیاسەتکردندا .. ٩٩**

١) بووناسییەکی ڕاست و دروست:.................................. ١٠١

٢) ئیمان و عەقیدەی ڕاست و ساغ:................................... ١٠٢

٣) خواپەرستیی و پارێزکاریی: ....................................... ١٠٣

٤) دڵسۆزیی و خۆشەویستی بۆ خەڵك:................................ ١٠٤

پوختەی مەبەست و دەرەنــجـــــام.................................... ١٠٥

بەرهەمەکانی دانەر ....................................................... ١٠٩

پێرســتە وشــە........................................................... ١٢٢

کورتەیەك لە مێژووی ژیانی مامۆستا عەلی باپیر .................... ١٢٤

نێوەڕۆك................................................................ ١٢٦

www.alibapir.com

# گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەتدا

پێم وانیە لە هیچ کەس شێردراوە بێ کە لەم ڕۆژگارەدا، مرۆڤایەتیی لەگەڵ گەلێک کێشەو قەیرانی جۆراوجۆردا دەستەو یەخەیە، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا: فیکرو کلتوور، حوکم وسیاسەت، خێزانیی و کۆمەڵایەتیی،ئابووریی و گوزەران، جەنگ و ئاشتیی، ژینگەو دەوروبەر ...هتد.

بەڵام پێم وایە: قەیرانی ڕەوشت و ئاکار (الأخلاق والسلوك) بە گشتیی و، بەتایبەت لە بواری حوکمڕانیی و سیاسەتکردندا، لە هەموو ئەو قەیرانانەی دیکە، گەورەتر و بەزەرتر و، چارەسەریشی قورستر و بە مەسرەفترە، ئەم کتێبەی بەردەستیشت، هەوڵێکە لەو پێناوەدا.

 www.alibapir.net

 /alibapir1

 /alibapir




**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر - شەقامی ۳۰مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

 /TafseerOffice

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

نرخی 4.000 دینار



9 789922 620169